# چارەســـــەر
# بە دوعا( الرُّقى)
# لە قورئان و سوننەتدا


نوسینی

سعيد على وهف القحطاني

وەرگێڕانی

حەمزە بەرزنجی

## بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

## گرنگی چارەسەرکردن بە قورئان وسوننەت

ان الحمد لله نحمده، ونستعينه. ونستغفره. ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات اعمالنا. من يهده الله فلا مضل له. ومن يضلل فلا هادي له. وأشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له. وأشهد انّ محمد عبده ورسوله. صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين وسلم تسليما كثيرا.. اما بعد:

**بێ گومان چارەسەرکردن بە قورئانی پیرۆزو بەو فەرموودانەی کە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە لەبارەی دوعا خوێندن بەسەر نەخۆشدا چارەسەرێکی بەسوودو شیفادەرێکی تەواوە**..(قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞ )**فصلت/٤٤** (وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا ﴿٨٢﴾ )**الأسراء/٨٢**

لێرەدا بۆ ڕوون کردنەوەی ڕەگەزەکەیە کە بڕوادارانە. وەقورئان بەڕاستی هەمووی شیفایە هەروەکو لەوئایەتەی پێشوودا **دیارە**[1] (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٥٧ )یونس/٥٧

وە قورئان چارەسەرێکی تەواوە بۆ هەموو دەردێکی دڵ و لاشەو دنیاو قیامەت. وەهەموو کەسێکیش گونجاوو بەکەڵك نیە بۆ شیفادان بەقورئان. وەئەگەر نەخۆش بەچاکی چارەسەری نەخۆشیەکەی پێکرد بەڕاستی ئیمانەوەو بە وەرگیرانی تەواوو و بیرو باوەڕی دامەزراوە و بەهێنانەدی مەرجەکانی، ئەوا دەردو نەخۆشی هەرگیز بەرگەی ناگرێ. چۆن دەرد بەرگەی ووتەی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان دەگرێ کە ئەگەر دابەزیایەتە سەر کێوەکان هەڵی دەکەند.. یان دابەزیایەتە سەر زەوی شەقی دەکرد.

وە هیچ نەخۆشیەك نیە لەنەخۆشیەکانی دڵ و لاشە ئیلا لە قورئاندا ڕێگەی چارەسەرو هۆکاری خۆپاراستنی تێدایە لێی

---

(١) بڕوانە (الجواب الکافی لمن سأل عن الدواء الشافی)ابن القیم ل (٢٠)

بــۆ کەســێك کــەخوای گــەورە تێگەیشــتنی پێبەخشــیبێت بــۆ قورئانەکەی، وەخوای گەورە لەقورئانـدا باسـی نەخۆشیەکان و چارەســـەری دڵ و لاشـــەی کـــردووە. وەنەخۆشـــیەکانی دڵ دووجۆرن:

نەخۆشـی گومـان و دوودڵیـو، نەخۆشـی ئـارەزوو و هـەوەس. وەخوای گەورە باسی نەخۆشییەکانی دڵی کردووە بە گشتی وەباســـی هۆکارەکـــانی نەخۆشـــییەکەو چارەسەرەکەشـــی کردووە.[2] وەك دەفەرموێت:

﴿ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٥١ ﴾.العنکبوت/٥١

ابن القیم(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (فمن لم یشفیە القرآن فلا شفاە اللە، ومن لم یکفیە فلا کفاە اللە).[3]

واتە: ئەو کەسەی قورئان نەبێتە چارەسەرکەری خوا شیفای نەدات، وەئەوەی قورئان بەس نەبێت بۆی و ڕازی نەکات خوا ڕازی نەکات. وەنەخۆشییە جەستەییەکانیش قورئان ڕێگەی

---

[2] بڕوانە زاد المعاد ٤/٦ و ٤/٣٥٢

[3] زاد المعاد٤/٣٥٢

چارەسـەرکردن و هـەموو بنچـینەکانی دیـاری کـردووە، وە ئـەو بنچینانەی چارەسەرکردنی لاشە هەمووی لە قورئاندا هەیـە کـە ئــەوانیش سیانە: پاراســتنی تەندروســتی وە خۆپاراســتن لــە ئەزێتدەرەکان. وەوازهێنان لە مادە تێکدەرە زیانبەخشەکان وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر هەموو بەشەکانی تری ئەم جۆرە.[٤]

وە ئەگـەر بەنـدە بـە چـاکی چارەسـەری خـۆی بـە قورئـان بکـات ئەوا ئەبینیٚ کە چەندە کاریگەریەکی سەرسوڕهێنەری هەیـە لـە شیفادانی خێرادا.

ئیمامی ابن القیم دەفەرمووێت: (کاتێك بەسـەرمدا تێپـەڕی کـە لـە مەککـەدا نـەخۆش کـەوتم، وە هـیچ پزیشـك و دەرمـانێکم شـك نـە دەبــرد، بۆیــە خــۆم چارەســەری خــۆمم دەکــرد بەســورتی (الفاتحـة)وکاریگەریـەکی سەرسـوڕهێنەرم بـەدی کـرد، هەنـدێك ئاوی زەمـزەمم هێنـاو چـەند جارێك سورەتی(الفاتحة)م بەسـەردا دەخوێنــدەوەو ئــەم خــواردەوە.. ســەیرم کــرد بەتــەواوی چــاك دەبوومەوە، بۆیە ئیتر لە هەموو ئازارێکدا ئەم شتەم دەکردو بەو

---

[٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو ٣٥٢/٤و ٦/٤

پەڕی کەڵك سوودم لێوەر دەگرت، وەئەم شتەم باس دەکرد بۆ هەر کەسێ کە ئازاری هەبوایەو زۆربەیان بەخێرایی چاك دەبوونەوە.[٥] وەهەروەها چارەسەر کردن بەو دوعایانەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) وارید بووە لەچاکترین دەرمانە. وە پاڕانەوەی دوور لە بەربەست لە بەسوودترین هۆکارێکە بۆگەڕاندنەوەی ناخۆشیو گیرابوونی مراد و داواکاری، وە کاریگەرترین دەرمانە بەتایبەتیش ئەگەر لەگەڵ سووربون (الحاح)و دووبارە کردنەوەی زۆردا بێت تیایدا. وە ئەمەش دوژمنی نەخۆشییەو بەرەنگاری دەبێتەوەو چارەسەری دەکات و ڕێگری دابەزینی دەکات، یان سووکی دەکاتەوە ئەگەر دابەزی.[٦] (الدعاء ينفع مما نزل ومما لم ينزل فعليكم عباد الله بالدعاء).[٧]

واتە: پاڕانەوە کەڵکی هەیە بۆ ئەو بەلاًیەی کە دابەزیوەو ئەوەی کە دانەبەزیوە، دە بەندەکانی خوا بپاڕێنەوە.(لايرد القضاء الا الدعاء، ولا يزيد في العمر الا البر).[٨]

---

[٥] بڕوانە زاد المعاد ١٧٨/٤، والجواب الكافي لاپەڕە (٢١)

[٦] بڕوانە الجواب الكافي لاپەڕە (٢٢-٢٥)

[٧] الترمذي والحاكم وأحمد وحسنه الالباني . بڕوانة صحيح الجامع ١٥١/٣ برقم٣٤٠٣

[٨] الحاكم والترمذي وأحمد وحسنه الألباني بڕوانە سلسلة الاحاديث الصحيحة ٧٦/١برقم ١٥٤

واتە: هیچ شتێك نابێتە هۆی گەڕاندنەوەی قەزا تەنها پاڕانەوە نەبێت، وە هیچ شتێك نیە ببێتە هۆی زیادبوونی تەمەن جگە لە چاکە.

بەڵام لێرەدا شتێك هەیە کە دەبێت ئاگادار بین لێی: ئەویش ئەوەیە کە ئایەتەکانی قورئان و زیکرەکان و پاڕانەوەکان و پەنا گرتنەکان کە بۆ چارەسەر دەکرێت و دوعای پێ دەکرێت لە خودی خۆیدا بە کەڵك و شیفادەرە بەڵام پێویستی بە وەرگیران و بەهێزی بکەرەکەیو کاریگەری هەیە. کەواتە هەرهاتێك شیفاکە دوور کەوتەوەو نەدرا ئەوە لەبەر لاوازی کاریگەری بکەرەکەی بووە، یان لەبەر وەرنەگیرانی ئەو کەسەی لێی دەکرێ یان لەبەر بەرهەڵستکارێکی بەهێز کەبەرهەڵستی کاریگەری دەرمانەکە دەکات.. کەواتە چارەسەر بەدوعا بەدوو شێواز دەبێت:

<u>یەکێکیان لەلایەن نەخۆشەکەوەو ئەوی تریان لەلای</u> چارەسەرکەر، ئەوەی کە لە لای نەخۆشەوەیە سەر دەگرێ بەهۆی بەهێزی دەروونیو ڕاستی ڕوو کردنە خوای گەورەو باوەڕبوونی تەواوی بەوەی کە قورئان شیفاو رەحمەتە بۆ بڕواداران. وەپەنا گرتنی راست کە دڵ و زوبان پێی ڕاهاتووە،

لەبەرئەوەی ئەم جۆرە کارە جەنگینە وە جەنگاوەریش سەرکەوتنی دەست گیر نابێت بەسەر دوژمندا مەگەر بە دوو شت نەبێت:
ئەبێ چەکەکەی خۆی لە خۆیدا چاك بێت، وە دەبێت بازووی بەهێز بێت. وەهەر کات یەکێك لەم دووانە نەما ئەوا چەکەکە زۆر کارگەری نابێت چ جای ئەوەی کە ئەگەر هەردوو شتەکە نەما، ئەوا ئەو کاتە دڵ دەبێتە کاولە لە یەکتاپەرستیو پشت بەستن و تەقواو روو تێکردن و بەبێ چەکیش دەمێنێتەوە.
وە شێوازی دووەم لەلایەنی چارەسەرکەرەوەیە بە قورئان و سوننەت: ئە بێت ئەمیش ئەو دوو سیفەتەی تیابێت.[٩]
لەبەر ئەوە ابن التین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت:
(الرقى بالمعوذات وغيرها من أسماء ألله هو الطب الروحاني اذا كان على لسان الابرار من الخلق حصل الشفاء بإذن الله تعالى).[١٠]
واتە: دوعای چارەسەرکردنی نەخۆشی بە پەناگرتن و غەیری ئەو لە ناوەکانی خوا چارەسەرێکی ڕۆحانیيە ئەگەر لەسەر

---

[٩] بروانە زاد المعاد٤/٦٨ والجواب الكافى لا ٢١

[١٠] فتح البارى ١٠/١٩٦

زوبانی خەڵکانی پاکی بێتاوان ڕوویدا ئەوا شیفا دەدرێت بە ئیزنی خوای گەورە.

وەزانایان هەموویان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە دوعاکردن بۆ چارەسەری نەخۆشی جائیزە لەکاتی کۆ بوونەوەی ئەم سێ مەرجە تیایدا:

١–ئەبێت دوعاکە بە ووتەی خوای گەورە بێت یان بە ناوەکانی یان بەسیفاتەکانی یان بە ووتەی پێغەمبەرەکەی بێت(ﷺ).

٢–ئەبێت دوعاکە بە زوبانی عەرەبی بێت یان بەوشێوەیەی کە ماناکەی جیابکرێتەوە لەشتی تر.

٣–ئەبێت باوەڕی وابێت کە دوعا هیچ کاریگەری ذییە بە تەنها بەڵکو بە توانای خوای گەورەیە.[11] وە دوعاش هۆیەکە لە هۆکارەکان.

لەبەر ئەم گرنگیە زۆرە بەشی دوعام لەکتێبەکەم (الذكر والدعاء والعلاج بالرقى من الكتاب والسنة ) کورتکردەوەو چەند سودێکی بەکەڵکم زیادە خستە سەری ئەگەر خوا بیەوێت. وەداواکارم لە خوای پەروەردگاری بەرز بە ناوە

---

[11] بروانە فتح البارى ١٩٥/١٠. وفتاوى العلامه ابن باز ٣٨٤/٢

جوانـــەکانیو ســـیفەتە بـــەرزەکانی کـــەوام لـــێ بکـــات تـــەنها لەبەرخاتری خۆی بێت و کەڵك و سوودم پێبگەیەنێ بەهۆیـەوە، وە کەڵك بەو کەسەش بگەیەنێت بە هۆیەوە کە دەیخوێنێتەوە یان چاپی دەکات یان دەبێتە هۆکار بۆ بڵاوکردنەوەی، وەکەڵك بـــە هـــەموو موســـڵمانان بگەیـــەنێت چـــونکە هـــەر خـــۆی سەرپەرشتکاری ئەو شتەیەو بەتوانایە بەسەریدا.

وصلى الله وسلم و بارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين

هەژاری لای خوا

سعيد بن على بن وهف القحطانى

حرر فى ١٤١٤/٦/١٨ هـ

## چارەسەرکردنی جادوگەری( السحر )

چارەسەری خوایی بۆ چادووگەرێتی دوو بەشە :

بەشـــی یەکـــەم ئـــەو شـــتەی کـــە خـــۆی پێـــدەپارێزرێت لـــە جادوگەرێتی پێش ڕوودانی لەوانە:

١ – هەستان بە ئەنجام دانی هەموو واجبەکان، وە وازهێنان لـە هەموو حەرامەکان، وەتەوبە کردن لەهەموو خراپەکان.

٢– زۆر خوێنـدنی قورئـانی پـیرۆز بـە جۆرێـك هـەموو ڕۆژێـك بەشێکی دیاری کراوی هەبێت لە خوێندنەوەی.

٣– خۆپاراســـتن بـــە پاڕانـــەوەو پەناگرتنـــەکان و زیکـــرە شـەرعیەکان: لەوانـە ووتنـی(بسـم الله الـذی لایضـر مـع اسمـە شیء في الأرض ولا في السماء وهو السمیع العلیم )سـێ جار لـە بـەیانیان و ئێوارانـدا.[12] وە خوێنـدنی (آیـة الکرسـی)دوای هـــەموو نوێـــژەکان و لـــەکاتی خەوتنـــدا، وەلـــە بـــەیانیان و ئێوارانـــدا،[13] وەخوێنـــدنی ســـورەتی (قـــل هـــو الله احـــد) و(المعـوذتین)واتـە سـورەتی (الفلـق و النـاس) سـێ جـار لـە

---

[12] الترمذيوابو داود وابن ماجه. بڕوانه صحیح ابن ماجه٢/٣٣٢

[13] بڕوانە: الحاکم وصحیحه وافقه الذهبی ١/٥٦٢ و صحیح الترغیب والترهیب للالبانی ١/٢٧٣ برقم ٦٥٨

بەیانیان و ئێوارانداو لەکاتی خەوتندا، وە ووتنی (لااله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)سەد (١٠٠) جار لە ڕۆژێکدا.[١٤] وەپارێزگاری کردن لە زیکرەکانی بە یانیان و ئێواران و زیکری دوای نوێژەکان و زیکری خەوتن و هەستان لە خەوو زیکری چوونەماڵەوەو هاتنە دەرەوە لێی. وە زیکری چونە مزگەوت و هاتنە دەرەوە لێی، وەدوعای چوونە سەرئاوو هاتنە دەرەوە لێی. وە دوعای بینینی کەسێکی تووش بوو بە بەڵایەك، وە غەیری ئەمانە. کە زۆرم لەم زیکرو نزایانە هێناوەتەوەو باسم کردوە لە (حصن المسلم )دا بە پێی شێوازو بۆنەو شوێن و کاتەکانی. بێگومان پارێزگاری کردن لەمانە لەو هۆکارانەن کە ڕێگرن لە تووش بوون بە (سحر)و (چاو)و (جنۆکە) بە ئیزنی خوای گەورە. وە هەروەها لە گەورەترین چارەسەرێکە دوای تووش بوون بەم بەڵایانەو غەیری ئەمانەش.[١٥]

---

[١٤] البخاری ٤/٩٥، ومسلم ٤/٢٠٧١

[١٥] بڕوانە: زاد المعاد٤/١٢٦، ومجموع الفتاوی العلامه ابن باز٣/٢٧٧ وە بڕوانە ئەو (دە) هۆکارە کە بەهۆیەوە خراپەی حەسوودبەرو ساحر لادەبرێ لە بەشی سێیەم لە چارەسەرکردنی چاو لەم کتێبەدا.

٤-خــواردنی حــەوت دەنكــە خورمــا لەســەر برســێتی لــە بەیانیانیاندا ئەگەر گونجا، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ):
(من أصطبح بسبع تمرات عجوة لم يضره ذلك اليوم سم ولا سحر).[١٦]

واتە: هەركەسێك بەیانی لەسەر برسێتی حەوت خورمای تەڕی (عجوة) بخوات ئەوا ئەو ڕۆژە نە ژەهرو نە سیحر كاری تێناكەن و زیانی پێناگەیەنێت، وەچاكتروایە لە خورمای شاری (مەدینە) بێت لە نێوان (الحرتين)هەروەك لە ڕیوایەتی ئیمامی موسلیم دا هاتووە، وە مامۆستای بەڕێز(عبدالعزیزی كوڕی عبداللهی كوڕی بـــاز) پێی وایە كە هەموو جۆرە خورمایەكی شاری مەدینە ئەم سیفەتەی تێدا هەیە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ((من اكل سبع تمرات مما بين لابيتها حين يصبح......)فەرموودەكە.[١٧]
هەروەكو پێی وایە كە ئەمە چاوەڕون دەكرێت لەو كەسەی كە حەت خورما دەخوات لەغەیری خورمای (مەدینە) بەهەموو شێوەیەك .

[١٦] البخاری مع الفتح ٢٤٧/١٠. ومسلم ١٦١٨/٣
[١٧] مسلم ١٦١٨/٣

**بەشی دووەم: چارەسەرکردنی سیحر دوای ڕوودانی**

**ئەمیش چەند جۆرێکە:**

**جۆری یەکەم:** دەرهێنان و پوچەڵ کردنەوەی ئەگەر شوێنەکەی زانی بەو ڕێگایانەی کە شەرع ڕێی پێداوە، وەئەمەش ئەوپەڕی ڕێگاو هۆکارە کە زۆر جار چارەسەری سیحر لێ دراوی پێ دەکەن.[18]

**جۆری دووەم:** بە دوعای شەرعی، وە لەوانە:[19]

أ- حەوت گەڵای (سیدری سەوز) لە نێوان دوو بەردا یان شتی ڕەقدا دەکوتێ و دەیهێنێ و پاشان ئەوەندەی ئاو پێدا دەکات کە بەشی خۆشتن بکات و ئەم ئایاتانەی بەسەردا دەخوێنێت:

﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةࣱ وَلَا نَوۡمࣱۚ لَّهُۥ مَا فِی ٱلسَّمَـٰوَ ٰتِ وَمَا فِی ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِی یَشۡفَعُ عِندَهُۥۤ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ یَعۡلَمُ مَا بَیۡنَ أَیۡدِیهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا یُحِیطُونَ بِشَیۡءࣲ

---

(18) بڕوانە: زاد المعاد ١٢٤/٤. والبخاری مع الفتح ١٣٢/١٠. ومسلم ١٩١٧/٤. ومجموع الفتاوی ابن باز ٢٢٨/٣

(19) بڕوانە (فتح الحق المبین فی العلاج الصرع والسحر والعین)ل ١٣٨.

مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ **البقره ٢٥٥**

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾

**الأعراف/١١٧-١٢٢**

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ **يونس٧٩-٨٢**

﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ٦٥ قَالَ
بَلۡ أَلۡقُواْۖ فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ
٦٦ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ٦٧ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ
أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٦٨ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ
كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ ٦٩ فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا
قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ٧٠﴾ **طه٦٥/٧٠**

بسم الله الرحمن الرحيم

قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢ وَلَآ
أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ٤ وَلَآ
أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٥ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦

بسم الله الرحمن الرحيم

قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣
وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤

بسم ألله الرحمن الرحيم

قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ
إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ
حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

بسم ألله الرحمن الرحيم

قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾
مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ
ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾

**وەدوای خوێندنی ئەم ئایەتانەی کە باس کرا بەسەر ئاوەکەدا. سێ جار لێی دەخواتەوەو بە پاشماوەکەی خۆی پێ دەشوات. وەبەمەش نەخۆشیەکە لادەچێت و نامێنێت بە ویستی خوای گەورە، وەئەگەر پێویستیی بە دووبارە کردنەوە کرد دووجار یان زیاتر قەیدی ناکات هەتاکو نەخۆشیەکە لادەچێت، وەئەمەش زۆر تاقیکراوەتەوەو خوای گەورە بەهۆیەوە**

سوودی گەیاندووە، وەئەمە بەسوودە بۆ کەسێك کە (تاڵ کرابێ) لەلای خێزانەکەی.[20]

ب- سورەتی (الفاتحه) و (ایه الکرسی )و دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی البقره، و سورەتی (الاخلاص) و (الفلق و الناس)دەخوێنێت سێ جار یان زیاتر لە گەڵ فووکردن و دەست هێنان بە ئازارەکەدا بەدەستی ڕاست.[21]

**ج-چەند پەنا گرتن و دوعای چارەسەری نەخۆشی( الرقی )و پاڕانەوەیەکی گشتی ( الجامعه ):**

١. (أسأل الله العظیم رب العرش العظیم أن یشفیك. حەوت جار).[22]

---

[20] بڕوانە ابن باز٣/٢٧٩ وفتح المجید ل ٣٤٦. و(الصارم البتار فی التصدی للسحره والاشرار)ی وحید عبدالسلام ل ١٠٩-١١٧ کە لێرەدا چەند دوعایەکی بەسوودی درێژی بەکەڵك هەیە ان شاءالله تعالی. ومنصف عبدالرزاق ١٣/١١. وفتح الباری١٠/٢٣٣

[21] بڕوانە: البخاری مع الفتح ٩/٦٢و مسلم ٤/١٧٢٣، والبخاری مع الفتح ١٠/٢٠٨

[22] الترمذی وأبو داود ٣/١٨٧، والترمذی ٢/٤١٠، وبڕوانە صحیح الجامع ٥/١٨٠و٣٢٢.

٢. خۆش دەست دەخاتە سەر ئەو شوێنەی ئازاری دێ لە لەشیداو سێ جار دەڵێت(بسم الله)، وە حەوت جار دەڵێت (أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر).[٢٣]

٣. (أللهم رب الناس أذهب البأس وأشف أنت الشافي لا شفاء الا شفاء ك شفاء لا يغادر سقما).[٢٤]

٤. (أعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان وهامة. ومن كل عين لامة).[٢٥]

٥. (أعوذ بكلمات الله التامات من شر ماخلق).[٢٦]

٦. (اعوذ بكلمات الله التامات من غضبه وشر عباده ومن همزات الشياطين وأن يحضرون).[٢٧]

٧. (اعوذ بكلمات الله التامات التي لايجاوزهن بر ولا فاجر من شر ماخلق، وبرأ و ذرأ، ومن شرماينزل من السماء ومن شر

---

[٢٣] مسلم ١٧٢٨/٤

[٢٤] البخاری مع الفتح٢٠٦/١٠، ومسلم ١٧٢١/٤.

[٢٥] البخاری مع الفتح ٤٠٨/٦

[٢٦] مسلم ١٧٢٨/٤

[٢٧] أبوداود الترمذی، وبڕوانە صحيح الترمذی ١٧١/٣

مـايعرج فيهـا، ومـن شـر مـا ذرأ في الأرض، ومـن شـر مـا يخـرج منها، ومن شر فتن الليل والنهار، ومن شر كل طـارق الا طارقـا يطرق بخير يا رحمن ).[٢٨]

٨. (اللـهم رب السـموات السـبع ورب العـرش العظـيم، ربنـا ورب كل شيء. فالق الحب والنوى، ومنزل التوراة والأنجيل والقرآن، أعوذ بك من شر كل شئ أنـت آخـذ بناصـيته، انـت الأول فلـيس قبلك شـئ، وأنـت ألآخـر لـيس بعـدك شـئ، وأنـت الظـاهر فلـيس فوقك شئ، وأنت البـاطن فليس دونك شئ).[٢٩]

٩. (بسم اللّه أرقيك من كل شئ يؤذيك ومن شر كل نفس أو عين حاسد الله يشفيك بسم الله أرقيك).[٣٠]

١٠. (بسـم اللّه يبريـك ومـن كـل داء يشـفيك ومـن شـر حاسـد اذا حسد ومن شر كل ذي عين).[٣١]

---

[٢٨] مسند احمد ١١٩/٣ بأسناد صحيح، وابن السنى برقم ٦٣٧ و برِوانه: مجمع الزوائد١٠/١٢٧

[٢٩] مسلم٤/٢٠٨٤

[٣٠] مسلم عن ابى سعيد (رضي الله عنه)٤/١٧١٨

[٣١] مسلم عن عائيشة(رضي الله عنها)٤/١٧١٨.

١١. (بسم الله أرقيك من كل شئ يؤذيك من حسد حاسد ومن كل ذي عين الله يشفيك).[٣٢]

وه ئـهم پـهنا گـرتن و پاڕانهوانـه چارهسـهری جادووگـهریّتی (سـحر)و چـاوو دهسـت وهشـاندنی جنۆكـهو هـهموو نهخۆشـییهكانی پـیٚ دهكریّـت. وهئهمانـه دوعـای گشـتییه بهسوودن به ئیزنی خوای گهوره.

### جۆری سیٚیهم :

دهرهیّنانی خویّن به كهڵهشاخ گرتن (الحجامه) لهو جیّگهیه یان ئهندامهی كه شویّنهواره جادوگهریّتییهكهی تیّدا دهركهوتووه ئهگـهر ئهمـه گونجـا، وه ئهگـهر نـهگونجا ئـهوا ئـهو چارهسـهرانه كافیه كه باسمان كرد سوپاس بۆ خوای گهوره.[٣٣]

---

[٣٢] سنن ابن ماجه عن عباده بن الصامت(رضي الله عنه) و بڕوانه: صحيح ابن ماجه ٢٦٨/٢

[٣٣] بڕوانه زاد المعاد١٢٥/٤ وه لهویّدا چهند جۆریّك چارهسهری جادوگهریّتی ههیه دوای ڕوودانی خراپ نیه ئهگهر تاقی بكهیتهوهو سوودی لیٚ وهربگری، وه بروانه: مصنف ابن أبی شیبه ٣٨٦/٧-٣٩٧وفتح الباری٢٣٣/١٠-٢٣٤. ومصنف عبدالرزاق١٣/١١ والصارم البتار ل١٩٤-٢٠٠ والسحر حقيقته وحكمه للدكتور مسفر الدمينی ل ٦٤-٦٦.

## جۆری چوارەم:

دەرمانە سروشتی‌یەکان، چەند دەرمانێکی سروشتی بەسوود هەن کە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پاك دەست نیشانیان کردووە کە ئەگەر مرۆڤ بە یەقین و ڕاستی ڕوون کردنە خوای گەورەوە وەری بگرێت لەگەڵ ئەوەدا کە باوەڕی وابێت کە سوود بەخشینی لە لایەن خوای گەورەوەیە، ئەوا بە ویستی خوا سوودی پێدەگەیەنێت. هەروەك چەند دەرمانێکی گیراوەش هەیە لە گژوگیاو لەوبابەتانە، وە ئەمەش بەندە لەسەر تاقی کردنەوەو هیچ ڕێگرێك نیە لە بەکارهێنان و کەڵك وەرگرتن لێی بە پێی شەرع بە مەرجێك کە حەرام نەبێت.[٣٤]

وە لەو چارەسەرە سروشتیانەی سوودیان دەبێت بە ئیزنی خوا: (هەنگوین،[٣٥] وە ڕەشکە(الحبة السوداء)[٣٦]، وەئاوی زمزەم[٣٧] بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ

---

[٣٤] بڕوانە: فتح الحق المبين فى علاج الصرع والسحر والعين ل ١٣٩.

[٣٥] بڕوانە :ل (٥٣) و (فتح الحق المبين )ل ١٤٠.

[٣٦] بڕوانە: ل(٥٢) و (فتح الحق المبين) ل ١٤١

[٣٧] بڕوانە: ل (٥٤) و( فتح الحق المبين) ل١٤٤

مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ﴿٩﴾ ) ق/٩، وه زەیتی زەیتوون به پێی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): (كلوا الزيت وادهنوا به فإنه من شجرة مباركة).[٣٨]

واته: زەیتەکەی بخۆن و خۆتانی پێ چەور بکەن چونکه له دارێکی پیرۆزه. وەئەمەش له واقیعی تاقی کردنەوەو بەکارهێنان و خوێندنەوەدا چەسپاوه که چاکترین زەیته،[٣٩] وه له چارەسەرو دەرمانه سروشتییەکان:

خۆشۆردن و خۆ پاك کردنەوەو خۆ بۆن خۆش کردن.[٤٠]

## ٢-چارەسەر کردنی چاو لێدراوی:

چارەسەر کردنی چاولێدان چەند بەشێکه:

**بەشی یەکەم**: پێش تووش بوون.. ئەویش چەند جۆرێکه:

---

[٣٨] احمد في المسند ٤٩٧/٣. والترمذي وابن ماجه، وصححه الالباني في صحيح الترمذي ١٦٦/٢

[٣٩] بڕوانه: (فتح الحق المبين في علاج الصرع والسحر والعين) ل١٤٢.

[٤٠] بڕوانه: سەرچاوەی رابردوو ل ١٤٥.

١- خۆپاراستن و پارێزگاری لەو کەسەی کە لە چاوی ئەترسی، ئەویش بە زیکرەکان و پاڕانەوەو پەناگرتنە شەرعیەکان، هەروەك لە بەشی یەکەمدا لە چارەسەر کردنی جادوگەرێتیدا باسمان کرد.(٤١)

٢- ئەوەی کە ئەترسێت لە تووش بوونی شتێك بەهۆی چاوی خۆیەوە، ئەگەر شتێکی لە خۆی یان لەماڵی یان لە منداڵی یان براکەیدا یان لە غەیری ئەمانەدا بینی کە ببێتە مایەی سەرسوڕمانی بەرامبەرەکەت بپارێتەوەو بڵێ: (ماشاءالله لاقوة الا بالله، اللهم بارك علیه). بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): (اذا رأى أحدكم من أخيه مايعجبه فليدع له بالبركة).(٤٢)

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە شتێکی بینی لە براکەی‌دا کە سەرسامی دەکرد بابپاڕێتەوە بۆی بە بەرەکەت.

---

(٤١) بڕوانە: سەرچاوە رابووردو، وە لاپەرە(١٢) لەم کتێبەدا..

(٤٢) موطأ مالك ٢/٩٣٨ وابن ماجه ٢/١١٦٠ واحمد٤/٤٤٧ بڕوانە: صحيح ابن ماجه ٢/٢٦٥ و بڕوانە: زادالمعاد ٤/١٧٠و (الصارم البتار فى التصدى للسحره ولاشرار)ی شیخ وحيد عبدالسلام ل ٢٢٩-٢٥٢.

**٣- شاردنەوەی چاکەکانی ئەو شتەی کە دەترسێ چاوی لێ بکرێ.**[٤٣]

**بەشی دووەم:** دوای تووش بوون بە چاو، ئەمیش چەند جۆرێکە:

١-ئەگەر (چاو پیسەکە)زانرا کێیە فەرمانی پێ بکرێت کە دەست نوێژ هەڵبگرێ و پاشان ئەوەی کە تووش بووە بە چاو بە ئاوەکە خۆی بشوات.[٤٤]

٢-زۆر خوێندنی (قل هو الله أحد) و (الفلق والناس) و (الفاتحە) و (أیە الکرسی)وە کۆتایی سورەتی(ألبقرە)، وە پاڕانەوە شەرعیەکان لەگەڵ فووکردن و مەسح کردنی شوێنی ئازارەکە بە دەستی ڕاست، هەروەك لە جۆری دووەمدا لە چارەسەرکردنی جادوگەرێتیدا باسکرا لە بڕگەی (ج) لەژمارە ١-١١.[٤٥]

---

[٤٣] بڕوانە: شرح السنە للبغوی١٣/١١٦ زادالمعاد ٤/١٧٣.

[٤٤] بڕوانە: سنن أبی داود٩/٥ وزادالمعاد٤/١٦٣. وبڕوانە: (الوقایە والعلاج من الکتاب والسنە)ی محمد بن شاییع ل ١٤٤-١٤٧.

[٤٥] بڕوانە لاپەرەرە (١٥) لەم کتێبەدا

٣-(سورەتەکان ئەخوێنرێ بە ئاوێکدا لەگەڵ فووکردن، پاشان لێی دەخواتەوەو پاشماوەکەی دەکرێت بەسەریدا.[٤٦] یاخود بەسەر زەیتێکدا دەخوێنرێت و خۆی پێ چەوردەکات ).[٤٧] خۆ ئەگەر خوێندنەکە بەسەر ئاوی (زمزم)دا بێت ئەوە تەواوترە ئەگەر گونجا،[٤٨] یان بەسەر ئاوی ئاسماندا(واتە باران).[٤٩]

٤-قەیدی ناکات ئەگەر چەند ئایەتێك لە قورئان بنوسێتەوە بۆ نەخۆش و پاشان ئاوی پێدا بکرێ و بیخواتەوە،[٥٠] وە لەو ئایەتانە سورەتی (الفاتحە)و (أیە الكرسی)و دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرە)و (قل هو أللّٰه أحد)و(ألفلق و والناس)، وە پاڕانەوە شەرعی‌یەکان هەروەکو لە جۆری دووەمدا لە چارەسەرکردنی جادوگەرێتیدا باس کرا بڕگەی (ب)و(ج)لەژمارە١-١١[٥١]

---

[٤٦] سنن ابی داود٤/١٠ پێغەمبەر (ﷺ)ئەمەی کرد لە سابتی کوڕی قەیس.

[٤٧] مسند احمد ٤٩٧/٣ بڕوانە(سلسلة الأحاديث الصحيحة ١٠٨/١ برقم ٣٧٩)

[٤٨] بروانە لاپەرە ٦ و ٢٣ و ٥٥

[٤٩] بروانە لاپەرە ١٧

[٥٠] بڕوانە(زاد المعاد)ی ابن القيم٤/ ١٧٠وفتاوی ابن تيميه ٦٤/١٩

[٥١] بروانە لاپەرە (١٥) لەم کتێبەدا

بەشی سێهەم: ئەنجام دانی چەند هۆکارێك کە پاڵ بە چاوی حەسوودەوە دەنێت و خراپەی دوور دەخاتەوە ئەویش بەم جۆرەیە:

١-پەناگرتن بەخوا لە خراپەی.

٢-پارێزکاری(تقوی)ی خوای گەورەو پاراستنی فەرمانەکان و نەهیەکانی:(احفظ الله يحفظك..).[٥٢]

واتە: سنورەکانی خوا بپارێزە خوا دەتپارێت.

٣-ئارامگری لەسەر حەسوودبەرو لێ بووردن لێی و شەڕی لەگەڵدا نەکات، وەگلەیی لەلا نەکات و باسی ئەزیەت دانەکەی بۆ سەرئەم نەکات لەلای.

٤-پشت بەخوا بەستن چونکە هەر کەس پشت بە خوا ببەستێ ئەوە بەسیەتی.

٥-لە حەسوودبەر نەترسێو دڵی پڕ نەکات لە بیرکردنەوە لێی. کە ئەمەش لە بەسوودترین چارەسەرە.

٦-ڕووکردنە خواو دڵسۆزی بۆیو داواکردنی ڕەزامەندی لە خوای گەورە.

---

[٥٢] الترمذی بڕوانە: صحیح الترمذی٢/٣٠٩

**٧–تەوبەکردن لە تاوانەکان، چونکە تاوان دوژمنەکان زاڵ دەکات بەسەر مرۆڤدا:** ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ۝٣٠﴾ **سورەتی (الشوری)ئایەتی/٣٠**

**٨–خێرکردن و چاکەکردن چەندێك دەتوانیٚ، چونکە ئەمە کاریگەریەکی سەرسوڕهێنەری هەیە بۆ لابردنی بەڵاو چاوو خراپەی حەسوودبەر.**

**٩–کوژاندنەوەی ئاگری حەسوودبەرو یاخی و ئەزیەتدەر بە چاکەکردن لەگەڵیداو هەرکاتێك ئەزیت و خراپەو یاخیو حەسوودی زیادکرد لەسەرت تۆش زیاتر چاکەی لەگەڵدا بکەو ئامۆژگاری بکەو بەزەییت پێیدا بێتەوەو ئەمەش کەس ناتوانێت ئەنجامی بدات مەگەر کەسێك پاداشتێکی گەورەی لەلای خودا هەبێت.**

**١٠–نویٚ کردنەوەی یەکتاپەرستیو پاکردنەوەو دڵسۆزی بۆ ئەو خوا بەهێزە کار بەجێیەی کە هیچ کەسێك زیان و سوودی پیٚ ناگات مەگەر بە ئیزنی ئەو. وەهەر ئەو کۆکەرەوەی هەموو ئەمەیەو ئاڕاستەی ئەم هۆکارانەیە. چونکە یەکتاپەرستی**

قـەڵای گـەورەی خوایی‌یـە کـە هەرکەسـێك تێـی بچـێت لـە پارێزراوان دەبێت.
وەئەمانـە(دە) هۆکـاربوون کـە بەهۆیـەوە خراپـەی حەسـوودبەرو چاوپیس و جادوگەر یاڵ پێوەدەنرێ و لادەدرێت.[53]

## ٣-چارەسەری چوونە ژوورەوەی جنۆکەبۆ مرۆڤ

چارەسەری ئەو کەسەی ڤێ و پەرکەمی هەیە کە جنۆکە چوبێتە لەشی‌یەوەو خۆی تێکەڵ کردبێ دووبەشە :

**بەشی یەکەم:** پێش تووش بوون: لە خۆپاراستن و پارێزگاری کـردن لـە هـەموو فـەرزەکان و واجیبـەکان و دوور کەوتنـەوە لـە هـەموو حەرامـەکان، وەگەڕانـەوە پەشـیمان بوونـەوە لەهـەموو تاوانــەکان و خۆپاراســتن بــە زیکــرو دوعــاو پەناگرتنــە شەرعیەکان.

---

[53] بڕوانە: (بدائع الفوائد)ی ابن القیم ٢/٢٣٨-٢٤٥

**بەشی دووەم :چارەسەر کردن دوای چوونە ژورەوەی چنۆکە:**

ئـەمیش بـە خوێندنـەوەی چارەسـەر دەبـێ لـە لایـەن ئـەو موسـڵمانەی کـە دڵ وزوبـان و دۆعاکـەی بـۆ کـەس نەخۆشـەکە ئـاوێزان کـردووە. وە گـەورەترین چارەسـەر(الرقی)یە بەسـورەتی(الفاتحە)[٥٤]و(ایـە الکرسـی)و دووئایـەتی کۆتـایی سورەتـی (البقرە)و (قل هو اللّه أحـد)و (والفلـق و النـاس) لەگـەڵ فـووکردن بەسـەر کەسـەکەداو سـێ بارەکردنـەوەی ئەمـە یـان زیاتر، وە غـەیری ئـەمان لەئایەتـەکانی قورئـان. چونکە قورئـان هـەمووی شـیفای تێدایـە بـۆ ئـەوەی لـە سـنگەکاندایەو شـیفاو هیدایەت و ڕەحمەتە بۆ بڕواداران.[٥٥] وە پاڕانەوە(الرقی)یـەکان هەروەك لە جۆری دووەمدا لـە چارەسـەرکردنی جادووگەرێتیـدا باسکراوە. بڕگەی (ب)،(ج)[٥٦] وە لـەم چارەسەرەشـدا پێویسـتە دوومەرجی تێدا بێت:

---

[٥٤] بڕوانـە: سـنن ابـی داود٤/١٣-١٤، وأحمـد٥/٢١٠، وسلسـلە الأحاديـث الصحیحة/ژمارە٢٠٢٨

[٥٥] بڕوانە: الفتح الربانی ترتیب مسند الامام أحمد ١٧/١٨٣

[٥٦] بڕوانە: ل(١٩-٢٢)لەم کتێبەدا.

یەکـــەم: لەلایـــەن تـــووش بـــووە نەخۆشـــەکەوە بـــە بـــەهێزی دەروونیو ڕاستێتی ڕووکردنە خواو پەناگرتنی ڕاست کە دڵ و زوبانی لەسەری بەشدار بێت.

وە دووەم: لەلایـەنی چارەسـەرکەرەوە ئـەبێت ئـەمیش پێویسـتە بـەو شـێوەیە بێـت، چـونکە چـاکی چـەك بـەهۆی وەشـێنەرو بەکارهێنەرەوەکەیـەتی،[٥٧] وەخـۆ ئەگـەر بـانگ بـدات بـە گـوێی نوخۆشەکەدا چاکە چونکە شەیتان لەوە ڕادەکات.[٥٨]

---

[٥٧] بڕوانە: دوعایەکی درێژو بەسوود لە (وقایە الانسـان من الجـن والشـیطان)ل ٨١–٨٤. والصـارم البتـار١٠٩–١١٧(للشـیخ وحیـد عبدالسـلام ، وە بڕوانـە: زاد المعاد ٦٦/٤–٦٩ و(ایضاح الحـق في دخـول الجـني بأنسـی والـرد علـی مـن أنکـر ذلـك)ی عبـد العزیـز بـن عبـدالله بـن بـاز ل ١٤. وفتـاوی ابـن تیمیـة ٩/١٩–٦٥و ٢٧٦/٢٤ و الوقایـة والعـلاج مـن الکتـاب والسـنة)ی محمـد بـن شـایع ل٦٦–٦٩. وبڕوانە:(چۆنیەتی دەرکردنی جنۆکە لە ماڵدا )الوقایە والعلاج محمـد بن الشـایع ل٥٩ (عالم الجن والشیطان)ی أشقر ل١٣٠.

[٥٨] بڕوانە: فتح الحق المـبین فی العـلاج والصـرع والسـحر والعین ل١١٢والبخـاری برقم ٥٧٤

## ٤-چارەسەرکردنی نەخۆشیە دەروونیەکان[٥٩]

گــەورەترین چارەســـەر بــۆ نەخۆشـیـیە دەروونیـیــەکان و دڵ تەنگی بەکورتی بەم شێوەیە:

١-هیدایەت و یەکتاپەرستی، هەروەك چۆن گومڕایی‌و هاوبەش دانان لە گەورەترین هۆکارەکانی دڵ تەنگین.

٢-ڕووناکی ئیمانی. ئیمانی ڕاست کە خوای گەورە دەیهاوێتە ناو دڵی بەندەوە لەگەڵ کردەوەی چاك.

٣-زانیاری بەکەڵك. چونکە هەرکاتێ زانیاری بەندە فراوان بوو سنگی گوشاد دەبێت و فراوان دەبێت.

٤-پەشـــیمانی و گەڕانـــەوە بـــۆ لای خـــوای گـــەورە. وەخۆشویستنی بە راستی‌و لە ناخی دڵەوە، وەڕووتێکردن و چێژوەرگرتن لە پەرستنی‌دا.

٥-بـەردەوام بـوون لەسـەر زیکرکردنـی خـوا لەسـەر هـەموو حاڵەتێك و لە هەموو شوێنێکدا، چونکە زیکر کاریگەرییەکی

---

[٥٩] بڕوانــە (اســباب شــرح الصــدر) لــە (زاد المعــاد)دا (٢/٢٣-٢٨) وکتێبــی (الوسائل المفیده للحیاه السعیده) للعلامه عبدالرحمن بن ناصر السعدی.

سەرسووڕ هێنەری هەیە لە گوشادکردنی سنگ و ئاسوودەیی دڵ و نەمانی غەمو خەفەت.

٦-چاکەکردن لەگەڵ خەڵکیدا بە هەموو جۆرە چاکەیەکی سوود پێگەیاندنیان چەندێك دەتوانیٚ، چونکە خاوەن رێزی چاکەکار لە هەموو کەس زیاتر سنگ گوشادەو دەروون پاکەو دڵ ئاسوودەیە.

٧-ئازایەتی، چونکە بەڕاستی کەسی ئازا دڵ گوشادو سنگ و دڵ فراوانە.

٨-دەرکردنی خراپەو پیسی ناو دڵ و لەو سیفاتە پیسانەی کە دڵ تەنگ دەکات و ناڕەحەتی دەکات: وەکو (حەسودیو ڕق و قین و دوژمنایەتیو کینەو یاخی بوون وستەم). وە پێغەمبەری خوا(ﷺ)وە چەسپاوە کە پرسیاری لیٚ کرا دەربارەی چاکترینی خەڵکییەوە ئەویش فەرمووی: (کل مخموم القلب صدوق اللسان).واتە: هەموو دڵ روناکێکی زوبان راست، وتیان: زوبان راست دەزانین، ئەی دڵ رووناك کیٚیە؟

فـەرمووی: (هــو التقــی النقــی، لا اثــم فیــه. ولابغــی، ولاغــل، ولاحسد).[٦٠]

واتە: ئەو دڵە لە خواترسە پاکەیە کە گوناهو یاخیو کینـەو ڕق و حەسوودی تێدا نییە.

٩-وازهێنان لە زیادەڕەوی لە تەماشاکردن و قسـەکردن و گـوێ گرتن و تێکەڵاوی کردنی خەڵك و خواردن و خەوتن دا. چونکە وازهێنــان لەمانــە لــە هۆکــانی ســنگ گوشــادیو ئاســودەییو نەمانی خەم و خەفەتە.

١٠-خۆخـەریك کـردن بـە کارێـك لـەکارەکان یـان زانسـتێك لـە زانســتە بەســوودەکان، چــونکە دڵ کامــەران دەکــات دووری دەخاتەوە لەو شتەی تووشی دڵە ڕاوکێی کردووە.

١١-گرنگــی دان بــەکاری ئــەمڕۆی حــازرەوەو بچــڕاندنی لــە خەفەت خواردن بە شتە ڕابردووەکـان، چونکە ئـەو کاتـە بەنـدە خۆی سـەرقاڵ و مانـدوو دەکات بـەو شـتانەی کـە سـوودی پـێ دەگەیەنێ لەدین و دنیا. وەداوای سەرکەوتنی نیـازو مەبەسـتی

---

(٦٠) اخرجه ابن ماجة برقم ٤٢١٦، و بڕوانە صحیح ابن ماجە ٤١١/٢

لـه خوابكـات و پشـتی پـێ ببەسـتێت، چـونكە ئـەوە دووری دەخاتەوە لە خەم و خەفەت.

١٢-تەماشـــاكردنی ئەوانـــەی لـــە خـــوار خۆتـــەوەن و تەماشانــەكردنی ئەوانەی لەسەرو خۆتەوەن لـه لـەش ساغی و هاووێنەكانی لە ڕۆزیو هاووێنەكانیدا.

١٣-لەبیرخۆبردنـەوەی ئـەو شـتانەی لـە ڕابـردوودا تووشـی هاتوون، لەو ناخۆشیانەی كە ناتوانێت لایبات لەسەر خۆیو بیری لێ نەكاتەوە بەهیچ جۆرێك.

١٤-ئەگەر بەندە بێتاقەتیـەك لـە بێتاقەتیـەكان ڕووی تێكرد ئـەوا لەسـەریەتی هـەوڵ بـدات بـۆ كـەم كردنـەوەی بـەوەی كەخراپترین گریمانـە دابنێـت. كـە ئەوپـەڕی شتەكەیەو بەپێی توانای بەرگری لێبكات.

١٥-بـەهێزی دڵ و وەڕس نـەبوون و هەڵنەچوونی بـەهۆی ئـەو بیرو ئەندێشـانەوە كـە بیركردنـەوەی خـراپ دروسـتی دەكـات . وەتوڕە نەبوون پێیو گومانی نەمانی خۆشیو تووش بوون بە خراپـە نـەكات، بـەڵكو ئـەم كـارە بگەڕێنێتـەوە بـۆ لای خـوای گـەورەو لەگـەڵ هەسـتان بـە ئەنجامدانی هۆكـارە بەسـوودەكان وەداواكردنی لێبووردن و لەش ساغی لە خوا.

١٦-پشت بەستنی دڵ بەخواو تەوەکول کردن و گومانی باش بردن پێی، چونکە بێگومان ئەوەی پشت بەخوا دەبەستێت ئەندێشە کاری تێناکات .
١٧-خاوەن هۆش ئەزانێت کە بێگومان ژیانی ڕاست ئەو ژیانەیە کە بە ئاسوودەییو ئارامی دەبرێتە سەرو ئەویش زۆر کورتە. کەواتە ئەمیش کورتتری ناکاتەوە بەخەم و دڵەڕاوکێ لەگەڵ ئەندێشەکانیدا، چونکە ئەمە دژی ژیانی ڕاستەقینەیە.
١٨-ئەگەر هاتوو ناخۆشییەکی تووش هات هەڵی ئەسەنگێنێ لەنێوان ئەو نیعمەتانەی تووشی هاتووە بەهۆی دین یان دنیاوە لەگەڵ ئەوەی کە تووشی هاتووە لە ناخۆشی، ئەوکات لەکاتی هەڵسەنگاندنیدا زۆری ئەو نیعمەتانەی بۆدەردەکەوێت کەئەم تیایەتی. هەروەها هەڵسەنگاندن دەکات لەنێوان ئەو ترسەدا کە هەیەتی لەڕوودانی زەرەروو زیان لێی لەگەڵ ئەو گریمانە زۆرانەی کە سەلامەتی دەگەیەنێ، ئەوکاتە نایەڵێت گریمانی لاواز زاڵ بێت بەسەر گریمانە زۆر بەهێزەکانیدا. وەبەمەش خەم و ترسەکەی ئەڕەوێتەوەو نامێنێ.
١٩-ئەزانێت کە بێگومان ئەزیەتدانی خەڵکی بۆی زیانی پێ ناگەیەنێ بە تایبەتی لە ووتە پیسەکانیاندا، بەڵکو زیان

بەخۆیان دەگەیەنێ، بۆیە گوێی پێنادات و بیری لێناکاتەوە هەتا زیانی لێنەدا.

٢٠-هەموو بیرکردنەوەکانی دادەنێت بۆ ئەو شتانەی کە بەسوود دەگەڕێتەوە بۆی لەدین و دونیادا.

٢١-ئەبێت بەندە داوای سوپاس نەکات لە کەس لەسەر ئەوچاکەیەی کەئەنجامی داوەو کردوویەتی تەنها لەخوا نەبێت. وەدەبێت بزانێت کە ئەم مامەڵەیەی ئەم لەگەڵ خوادایە، بۆیە گوێ نادات بە سوپاسی ئەو کەسەی چاکەکەی لەگەڵ کردووە:

(إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾)

سورەتی الأنسان /٩.

٢٢-بابەتە بەکەڵکەکان بکاتە نیشانەی بەردەمی چاویو کارکردن بۆ دەستەبەرکردنی، وە ئاوڕنەدانەوە بەلای بابەتە زیانبەخشەکانداو خۆی پێوە خەریک نەکات و بیری لێ نەکاتەوە.

٢٣-ئەنجامدانی کارەکانی لەئێستاداو وازهێنان لەداهاتوو، تاکو بۆ کارە داهاتووەکانی بەهێزی بیرکردنەوەو کارەوە بچێت.

٢٤-لــەكارو زانســتە بەســوودەكاندا گــرنگترین و گــرنگترین هەڵبــژێرێت و دیــاری بكــات، بەتایبــەتی لەوانــەدا كــە زۆر ئـارەزووی هەیـە لێـی. وەپشـت بەسـتن لەمـەدا بـەخوا پاشـان بەڕاویـژ كـردن، خـۆ ئەگـەر بەرژەوەنـدی خـۆی دیـاری كـردو عەزمی پەیداكرد ئەوا پشت بەخوا ببەستێت بۆ ئەنجامدانی.
٢٥-بـاس كردنـی نیعمەتـە ڕواڵـەتیو ناوەرۆكییـەكانی خـوا بەسـەریەوە چـونكە زانـین و باسـكردنی ئـەو نیعمەتانـە خـوای گـەورە بەهۆیـەوە خـەم و خەفـەتی پـێ لادەبـات و بەنـدە هـان دەدات بۆ سوپاس كردنی.
٢٦- مامەڵـەكردن لەگـەڵ خێـزان و نزیـك و خـەڵكیو هـەموو ئەوكەسـانەی كـە لـە نێـوان تـۆو ئـەودا پەیوەندیـەك هەیـە بـەو شێوەیەی كـە ئەگـەر كـەم و كورتییـەكت تێدا بیـنین ئـەوا ئـەو چاكانەی كەهەیـەتی بـیری خـۆت بێنـەرەوە، چـونكە بـەتێبینی كردن و ڕەچاو كردنی ئەمە هاوەڵایەتییەكە درێـژە دەكێشـێ و دڵ گوشاد دەبێ: (لایفرك مؤمن مؤمنه ان كره منها خلقا رضـی منها أخر).[٦١]

---

[٦١] مسلم ١٠٩١/٢

واته: هیچ بڕواداریْکی نیْر بڕواداریْکی میْ نەبوغزیْنیْ و بەکەم سەیری نەکات با ئەگەر ڕەوشتیْکی بەدلْ نەبوو لە ڕەوشتیْکی تری ڕازی ببیْ.

٢٧-پاڕانەوە لە خوا بەچاك کردنی هەموو کارەکانت، وە لە هەمووی گەورەتر ووتنی: (أللهم أصلح لي ديني الذى هو عصمة أمرى، ودنياي التى فيها معاشي، وآخرتي التي اليها معادي. واجعل الحياة زيادة لي في كل خير، والموت راحة لي من كل شر).(٦٢) وەهەروەها: (أللهم أرجوا رحمتك فلا تكلني الى نفسي طرفة عين وأصلح لي شأني كله لااله الا أنت ).(٦٣)

٢٨-تیْکۆشان (جیهاد) لەپیْناوی خوادا بەپیْی فەرموودەی پیْغەمبەر(ﷺ): (جاهدوا في سبيل الله، فإن الجهاد في سبيل الله باب من أبواب الجنة ينجي الله به من الهم والغم).(٦٤)

---

(٦٢) مسلم ٢٠٨٧/٤

(٦٣) ابو داود ٣٢٤/٤، وأحمد ٤٢/٥

(٦٤) أحمد٣١٤/٥، ٣١٦، ٣١٩، ٣٢٦،٣٣٠، والحاكم وصححه ووافقه الذهبى ٧٥/٢.

واته: بجەنگن لەپێناوی خوادا، چونکە جیهاد لە پێناوی خوادا دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت، وە بەهۆیەوە خوای گەورە لەخەم و خەفەت ڕزگارت دەکات .

ئەم هۆکارو هۆیانە چارەسەرێکی بەسوودن بۆ نەخۆشی‌یە دەروونیەکان و لەگەورەترین چارەسەرەکانن بۆ دڵەڕوکێی دەروونی، بۆکەسێك لێی وردبێتەوەو کاری پێبکات بەڕاست گۆیی‌و دڵسۆزی‌یەوە. وەهەندێك لە زانایان زۆرێك لەحاڵەت و نەخۆشی‌یە دەروونیەکانیان پێ چارەسەرکردووەو خوای گەورە سوودێکی زۆری پێگەیاندوون.[٦٥]

### ٥-چارەسەری برینداری‌و زام

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر کەسێك ئازارێکی هەبوایە یان زام یان برینداری پێوەبووایە پەنجەی ئاوها لێ دەکرد(سوفیان پەنجەی شایەتمانی دا لە زەوی‌یەوەو پاشان بەرزی کردەوە)، وەدەیفەرموو: (بسم الله تربة أرضنا بريقه بعضنا يشفى

---

[٦٥] بڕوانە: پێشەکی (الوسائل المفيده)چاپی پێنجەم ل ٦

سـقيمنا بـاذن ربنـا). [٦٦] وەمانـای فەرموودەکـە ئەوەیـە کـە هەندێك تـەڕایی دەمـی خـۆی دەدا لەپەنجەی شایەتمانییەوەو پاشان دەیخاتە سەرزەویو هەندێك تۆزو گڵی پێوە دەنیشێ و دەیسرێ بەسـەر شوێنەواری برینداریيەکـە یـان ئازارەکەیداو ئەو نزایە دەڵێ لەکاتی مەسح کردنیدا. [٦٧]

**٦-چارەرسەری موسیبەت**

١-(مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٢٢﴾ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾) الحديد٢٢-٢٣

---

[٦٦] البخاری مع الفتح ٢٠٦/١٠ ومسلم ١٧٢٤/٤ برقم ٢١٩٤

[٦٧] بڕوانە: شرح النووی علی صحیح مسلم ١٨٤/١٤ وفتح الباری٢٠٨/١٠، و بڕوانە ڕوون کردنەوەیەکی تەواوی فەرموودەکە لە(زاد المعاد ١٨٦/٤-١٨٧)دا

٢- ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ١١﴾ التغابن/١١

٣- (مامن عبد تصيبه مصيبة فيقول: انا لله وانا اليه راجعون، اللهم أجرنى في مصيبتي وأخلف لي خيرا منها الى أجره الله في مصيبته وأخلف له خيرا منها).[٦٨]

واته :هيچ بەندەيەك نيە كە تووشى موسيببەتێك دەبێت و دەڵێت: ئێمە دروستكراوى خواين و بۆلاى ئەو دەگەڕێينەوە، خوايە پاداشتم بدەيتەوە لەسەر ئەم موسيبەتەم و كەسێكى باشترم بۆبخەيتەوە جێى (لەجێى مردووەكە) ئيلا خواى گەورە پاداشتى ئەداتەوەو كەسێكى چاكترى دەخاتەوە شوێن.

٤- (اذا مات ولد العبد قال الله لملائكته: قبضتم ولد عبدى؟ فيقولون: نعم، فيقول: قبضتم ثمرة فؤاده؟ فيقولون: نعم، فيقول: ماذا قال عبدى؟ فيقولون: حمدك وأسترجع، فيقول الله: ابنوا لعبدى بيتا في الجنة وسموه بيت الحمد).[٦٩]

---

[٦٨] مسلم ٢/٦٣٣.

[٦٩] الترمذى. و بڕوانە صحيح الترمذى ١/٢٩٨.

واتـه: كاتێـك بەندەیـەك منـداڵێكی دەمرێـت، خـوای گـەورە بـە مەلائیكەتــەكانی دەفـەرموێت: گیـانی منــداڵی بەندەكــەمتان كێشـا؟ دەفـەرموون: بـەڵێ، دەفـەرموێت: بـەش وبـەری دڵیتـان لێوەرگرتەوە؟ دەفەرموون: بـەڵێ، دەفـەرمووێت: بەندەكـەم چـی ووت ؟ دەفەرموون: سوپاسی تۆی كردوو ووتی اناللە وانـا الیـه راجعـون. ئـەو جـا خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: كۆشـكێك لـە بەهەشتا دروست بكەن بۆ بەندەكەم و نـاوی لـێ بنـێن كۆشـكی سوپاس.

٥- (یقول اللّه تعالی ما لعبدی المؤمن عنـدي جـزاء اذا قبضـت صفیه من أهل الدنیا ثم احتسبه الا الجنة).[٧٠]

واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: لەلای من هیچ پاداشتێك نیـیە بـۆ بەندەیــەكی بـڕوادار كاتێـك خۆشەویســتەكەی دەمــرێنم لەدونیاداو پاشان ئەویش چاوەڕوانی پاداشتە لـە مـن جگـە لـە بەهەشت.

٦-وقـال علیـه الصـلاة والسـلام لرجـل مـات ابنـه: (ألا تحـب أن لاتأتي بابا من أبواب الجنة الا وجدته ینتظرك).[٧١]

---

[٧٠] البخاری مع الفتح ٢٤٢/١١.

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ)بە پیاوێکی فەرموو کە منداڵەکەی مردبوو: ئایا حەز ناکەیت کە بچیتە هەردەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت ئیلا ئەبینی منداڵەکەت چاوەڕوانت دەکات.

٧- (يقول الله عزوجل: اذا ابتليت عبدی بحبيبتيه فصبر (وأحتسب) عوضته منها الجنة) يريد عينيه.[٧٢]

واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەگەر بەندەیەکم تاقی کردەوە بە لێسەندنەوەی دووخۆشەویستەکەیو ئەویش ئارام گربێت و چاوەڕوانی پاداشت لە من بکات، ئەوا لەجێگەی ئەو دووانە بەهەشتی ئەدەمێ، کە لێرەدا خوای گەورە بەمەستی دوو چاوەکەی مرۆڤە.

٨- (مامن مسلم يصيبه أذی من مرض فما سواه الاحط الله به سيئاته كما تحط الشجرة ورقها).[٧٣]

---

[٧١] أحمد والنسائی وسنده علی شرط الصحيح، وصححه الحاكم وابن حبان. وبروانه فتح الباری ٢٤٣/١١

[٧٢] البخاری مع الفتح ١١٦/١٠، وە ئەوەی نێوان کەوانەکە لە سنن الترمذیدایە بڕوانە صحيح الترمذی٢٨٦/٢

[٧٣] البخاری مع الفتح ١٢٠/١٠ ومسلم ١٩٩١/٤.

واتە: هیچ موسڵمانێك نىیە كە تووشی ئازارێك دەبێت بەهۆی نەخۆشیيەكەوە يان شتی تر، ئیلا خوای گەورە بەهۆیەوە گوناهەكانی هەڵدەوەرێنێ هەر وەكو چۆن گەڵای دار هەڵدەوەرێ.

٩-(مامن مسلم يشاك شوكة فما فوقها الا كتبت لة بها درجة ومحيت عنه بها خطية).[٧٤]

واتە: هیچ موسڵمانێك نىیە كە دڕكێك دەچێت بە لاشەىدا يان ئازارێكی تووش دێت ئیلا بە هۆی ئەوەوە پلەيەكی بۆ دەنوسرێت و بەهۆیەوە تاوانێكی لێ دەسڕێتەوە.

١٠-(ما يصيب المؤمن من وصب ولانصب ولاسقم ولا حزن حتى الهم يهمه الا كفر به من سيئاته).[٧٥]

واتە: هیچ كاتێك نىیە كە بڕوادارێك تووشی ئازارێك يان هيلاكىيەك يان نەخۆشىيەك يان خەفەتێك دەبێت هەتا غەمێك كە تووشی دەبێت ئیلا خوای گەورە بە هۆیەوە لە تاوانەكانی دەسڕێتەوە.

---

[٧٤] مسلم ٤/١٩٩١

[٧٥] مسلم ٤/١٩٩٣

١١–(ان عظم الجزاء مع عظم البلاء، وان الله اذا أحب قوما ابتلاهم، فمن رضي فله الرضا، ومن سخط فله السخط).[٧٦]

واته: گەورەیی پاداشت لەگەڵ گەورەیی بەڵادایە، وەخوای گەورە ئەگەر کۆمەڵێکی خۆشویست تووشی بەڵایان دەکات و تاقییان دەکاتەوە. ئەو کاتە هەرکەسێ ڕازی بوو ئەوا خوا لێی ڕازی دەبێت، وە هەرکەسێك زویر بوو ئەوا خوا لێی زویر دەبێت.

١٢–(.....فما يبرح البلاء بالعبد حتى يتركه يمشي على الأرض وما عليه خطيئة).[٧٧]

واتە: بەڵا لە بەندە نابێتەوە هەتا وای لێدەکات بەسەر زەویدا دەڕوات و هیچ تاوانێکی پێوە نەماوە.

## ٧- چارەسەری خەم و خەفەت

١–(هیچ بەندەیەك نییە کە تووشی خەم و خەفەتێك ببێت و بڵێت: أللهم اني عبدك، ابن عبدك، ابن أمتك، ناصيتى بيدك،

---

[٧٦] الترمذی وابن ماجه. بڕوانه: صحيح الترمذی ٢/٢٨٦

[٧٧] الترمذی وابن ماجه، بڕوانه صحيح الترمذی ٢/٢٨٦

ماض فيّ حكمك، عدل فيّ قضاؤك، أسألك بكل اسم هو لك سميت بـه نفسـك أو انزلتـه في كتابـك، أو علمتـه أحـداً مـن خلقـك أو ستاثرت بـه في علـم الغيـب عنـدك ان تجعـل القـران ربيـع قلبـى، ونـور صـدري وجـلاء حزنـي وذهـاب همـى). ئـيلا خـواى گـەوره خـــەم و خەفەتەكـــەى لادەبـــات و دڵ خۆشـــى لـــە جێگەى‌ــدا دادەنێت.[78]

٢-(أللهم انى أعوذ بك من ألهم والحزن، والعجز والكسل والبخل والجبن، وضلع الدين و غلبة الرجال).[79]

## ٨-چارەسەری كاتی تەنگانەو زۆر سەغڵەتی( الكرب )

١-(لا اله الا الله العظيم الحليم، لا اله الا الله رب العرش العظيم، لا اله الا ألله رب السموات ورب الأرض ورب العرش الكريم).[80]

٢-(أللهم رحمتك أرجوا فلا تكلني الى نفسى طرفة عين وأصلح لي شأني كله لا اله الا أنت).[81]

---

[78] أحمد ٣٩١/١ وصححه الالبانى.

[79] البخـارى ١٥٨/٧ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) زۆر ئـەم دوعایـە دەكـرد. بڕوانـە: البخارى مع الفتح ١٧٣/١١

[80] البخارى ١٥٤/٧ ومسلم ٢٠٩٢/٤

**٣–(لا اله الا أنت سبحانك اني كنت من الظالمين).**[٨٢]

**٤–(أللّه أللّه ربي لا أشريك به شيئا).**[٨٣]

## ٩–چارەسەری نەخۆش بۆ خۆی:

**(دەست بخەرە سەر ئەو شوێنەی کە ئازاری دێت لە لەشتداو بڵێ: (بسم الله) سێ جار، وەحەوت جار بڵێ: (أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر).**[٨٤]

## ١٠–چارەسەری نەخۆش لە کاتی سەردانیدا

**(هیچ بەندەیەکی موسڵمان نییە کە سەردانی نەخۆشێك دەکات کە ئەجەلی نەهاتبێت و حەوت جار بڵێت: (أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك )ئيلا چاك دەبێتەوە.**[٨٥]

---

[٨١] ابو داود ٣٢٤/٤ وأحمد ٤٢/٥ وحسنه الألبانى وعبدالقادرالارناؤوط.

[٨٢] الترمذى٥٢٩/٥ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٥٠٥/١. وبروانه صحيح الترمذى ١٦٨/٣.

[٨٣] أخرجه أبو داود٨٧/٢ و بروانه: صحيح ابن ماجه ٣٣٥/٢، وبروانه صحيح الترمذي ١٩٦/٤.

[٨٤] مسلم ١٧٢٨/٤.

[٨٥] أخرجه الترمذى وأبوداود، بروانه: صحيح الترمذي ٢١٠/٢ وصحيح الجامع ١٨٠/٥.

### ١١-چارەسەر كردنی دڵەڕاوكێو ڕاچڵەكین لەخەودا

(أعوذ بكلمات الله التامات من غضبه وعقابه، وشر عباده ومن همزات الشياطين وأن يحضرون).[٨٦]

### ١٢-چارەسەركردنی (تـــــــا)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (الحمى من فيح جهنم فأبردوها بالماء).[٨٧]

واتە: (تـــــا) لە هالاّوی دۆزەخەوەیە. ساردی بكەنەوە بە ئاو.

### ١٣- چارەسەركردنی شوێنی پێوەدان (اللسعه واللدغه)

١-سورتی (الفاتحة) دەخوێنی لەگەڵ كۆكردنەوەی تفی دەمت و ڕۆكردنی لەسەر شوێنی گەزاوییەكە.[٨٨]

٢-دەستی پێدا دەهێنێت و بە ئاوو خوێ لەگەڵ خوێندنی (قل يا أيها الكافرون) و (الفلق و الناس).[٨٩]

---

[٨٦] أبوداود ١٢/٤ و بڕوانە صحيح الترمذی ١٧١/٣

[٨٧] البخاری مع الفتح ١٧٤/١٠ ومسلم ١٧٣٣/٤

[٨٨] البخاری مع الفتح٢٠٨/١٠

[٨٩] الطبراني فی المعجم الصغير ٨٣٠/٢ و بڕوانە(مجمع الزوائد١١١/٥) وحسن اسناده.

## ١٤-چارەسەرکردنی توڕەیی:

چارەسەر کردنی توڕەیی بە دوو ڕیگا دەبێت:

ڕیگای یەکەم :خۆپاراستن:

ئەمیش دێتەدی بەهۆی خۆپاراستن لە هۆکارەکانی توڕەبوون. وە لەهۆکارەکانی بریتی‌یە لە: خۆبەزلزانین و خۆ بەچاکزانین و لووت بەرزیو دنیاویستی لۆمەکراو، وەسوبعەت و دەست بازی بە بێ بۆنەو گاڵتە جاڕیو زۆر شتی تر...

ڕیگای دووەم: چارەسەرکردن ئەگەر تووڕەبوون ڕویدا:

١-پەناگرتن بەخوای گەورە لە شەیطانی نەفرین لێکراو(أعوذ بالله من الشیطان الرجیم).

٢-دەست نویژ هەڵگرتن.

٣-گۆڕینی ئەو حاڵەتەی کە تووڕەبووەکە لەسەرێتی: بەدانیشتن یان ڕاکشان یان چوونە دەرەوە یان قسە نەکردن یان شتی تر.

٤-بیری خۆ هێنانەوەی ئەو پاداشتانەی کە لە خواردنەوەی تووڕەیی‌یەوە دەست دەکەوێت و ئەو بەڵگانەی کە هاتووە لە چارەنووسی توڕەیی لە سەرشۆڕی).[٩٠]

---

[٩٠] بروانە: ڕوون کردنەوەی ئەمە بە بەڵگە صەحیحەکانی‌یەوە لە (افات اللسان ل ١١٠-١١٢)و (الحکمه فی الدعوه الی الله) ل ٦٤-٦٦ ی دانەر.

## ١٥-چارەسەر كردن بە (ڕەشكە)

قال(عليه الصلاة والسلام): (ان في الحبة السوداء شفاء من كل داء الا السام). قال ابن شهاب: السام: الموت، والحبة السوداء: (الشونين).[٩١]

واتە: لەڕەشكەدا شيفا هەيە بۆ هەموو نەخۆشىيەك تەنها مردن نەبێت.

وەڕەشكە سوودێكی زۆری هەيە، مەبەستيش لەووتەی (شفاء من كل الداء) وەكو نمونەی ووتەی خوا وايە كە دەفەرمووێ: (تدمر كل شئ بأمر ربها )الاحقاف/٢٥

واتە: بە فەرمانی خوا هەموو شتێك كاول دەكات كە شايەنی كاولكردن بێت.[٩٢]

---

[٩١] البخارى مع الفتح ١٤٣/١٠ ومسلم ١٧٣٥

[٩٢] زاد المعاد ٢٩٧/٤ و بڕوانە: (الطب من الكتاب والسنه)موفق الدين عبداللطيف البغدادى ل ٨٨.

## ١٦-چارەسەركردن بە هەنگوين

**١-خواى گورە لەباسى هەنگدا دەفەرموويْت:** ﴿ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٦٩﴾ **سورەتى النحل /٦٩.**

**واتە: لەناوسكى‌يەوە شلەيەك دەردەچىٚ كە ڕەنگى جياوازەو شيفاى تيْدايە بۆ خەڵكى ئا لەمەدا بەڵگە هەيە بۆ كۆمەڵيْك بير بكەنەوە.**

**٢-قال(عليه الصلاة والسلام ): (الشفاء في ثلاث: في شرطة محجم أو شربة عسل، أو كية بنار، وأنا أنهى أمتي عن الكي).**[٩٣]

**واتە: شيفا لەسىٚ شتدايە: لە كەلەٚشاخ گرتندا يان لە خواردنەوەى هەنگويندا يان داخ كردن بە ئاگر، وەمن نەهى ئەكەم لە ئوممەتەكەم لەداخ كردن.**

---

[٩٣] **البخارى مع الفتح ١٣٧/١٠ و بڕوانە(فوائد العسل)لة (زاد المعاد )٤/٥٠-٦٢ و(الطب من الكتاب والسنة)للعلامة موفق الدين عبداللطيف البغدادى ل ١٢٩-١٣٦.**

**١٧-چارەسەرکردن بە ئاوی زەمزەم:**

**١-قال(عليه الصلاة والسلام) في ماء زمزم: (انهاء مباركة، انها طعام طعم (وشفاء سقم).[٩٤]**

**واتە: بەڕاستی ئاوی زەمزەم پیرۆزەو خۆراکی خواردن و شیفای نەخۆشیو دەردە.**

**٢-وحديث جابر يرفعه: (ماء زمزم لما شرب له).[٩٥]**

**واتە: ئاوی زەمزەم بۆ هەموو نەخۆشیيەکە کە بە نیەتەوە بیخواتەوە.**

**٣-و( كان يحمل ماء زمزم في (ألاداوي) والقرب، فكان يصب على المرضى ويسقيهم).[٩٦]**

**واتە: ئاوی زەمزەمیان هەڵدەگرت لە قاپ و مەشکەداو ئەیانرشت بەسەر نەخۆشەکانداو دەرخواردیان ئەدان.**

---

[٩٤] مسلم ١٩٢٢/٤ وە ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە عند البزار والبيهقي والطبراني واسناده صحيح، بروانە:مجمع الزوائد ٢٨٦/٣.

[٩٥] أخرجە ابن ماجە وغيرە، بروانە: صحيح ابن ماجە ١٨٣/٢ وأرواء الغليل ٣٢٠/٤.

[٩٦] الترمذي والبيهقي٢٠٢/٥، و بڕوانە صحيح الترمذي٢٨٤/١. وسلسلة الأحاديث الصحيحة للألباني٥٧٢/٢ برقم٨٨٣ وزادالمعاد٣٩٢/٤.

ابن القيم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: من و غەیری منیش ئاوی زەمزەمان تاقی کردۆتەوە بۆ چارەسەری نەخۆشی سەرسوڕهێنەرانە چارەسەری چەندان نەخۆشیم پێکردووەو بەئیزنی خوا چاك بوومەتەوە.[97]

## ١٨-چارەسەری نەخۆشییەکانی دڵ:

جۆری دڵەکان سیانن:

١. دڵی ساغ (قلب السليم): ئەو دڵەیە کە کەس لەرۆژی دوایدا رزگاری نابێت بەو دڵەوە نەبێت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ٨٨ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ٨٩﴾ سورەتی (الشعراء)ئایەتی ٨٨-٨٩.

وە دڵی ساغ ئەو دڵەیە کە سەلامەت و پارێزاوە لە هەموو جۆرە ئارەزوویەك کەپێچەوانەی فەرمان و نەهییەکانی خوایە. وەسەلامەتە لە هەموو گوناهێك کە دژ بەو هەواڵانە بێت کە خوای گەورە داویەتی. وەسەلامەتە لە پەرستنی غەیری خوا.

---

(٩٧) زاد المعاد ٣٩٣/٤و ١٧٨.

وەسەلامەتە لە فەرمانبەرێتی غەیری پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، وە بە گشتی دڵی ساغی ڕاستەقینە ئەو دڵەیە کە سەلامەتە لەوەی جگە لە خوا هاوبەش دانانی تێدابێت بۆ هەرکەسێك. بەڵکو پەرستشەکەی بەپاك و دڵسۆزی بۆ خوایە لە ویست و خۆشەویستیو پشت بەستن و گەڕانەوەو مل کەچیو ترس و ئومێددا. وەکارەکانی دڵسۆزانە بۆ خوایە. خۆ ئەگەر کەسێکی خۆشەویست لەبەر خوایەو ئەگەر ڕقی لەکەسێك بوو لەبەر خوایە، ئەگەر بەخشی لەبەر خوایەو ئەگەر گرتیەوەو نەیبەخشی هەر لەبەر خوایە. تێگەیشتنی هەمووی بۆ خوایە. وە خۆشەویستی هەموی بۆ خوایە. وەمەبەستی بۆ ئەوە. . وەلاشەی بۆ ئەوە. . وەکارەکانی بۆ ئەوە.. وەخەوتنی بۆ ئەوە.. وەبەخەرهاتنی بۆ ئەوە...وە قسەکردنی لەبارەی خواوە خۆشترە لەلای لە هەمووقسەیەك، وە بیر کردنەوەکانی لە پێناوی ڕازی بوونی ئەوو خۆشویستنێتی.[٩٨] داوا لە خوا ئەکەین ئەو دڵەمان پێببەخشێت.

---

[٩٨] بڕوانە (اغاثة اللهفان من مصائد الشيطان)ی ابن القيم ١/٧و ٧٣

٢. دڵی مردوو(القلب الميت): ئەمە بە پێچەوانەی یەکەمەوەیە. ئـەمیش ئـەو دڵەیـە کـە خـوای خـۆی ناناسـێو نایپەرسـتیٚ بەجێبەجیٚکردنی فەرمانەکانیو ئەو شتانەی کە خوا خۆشـی دەویٚ و ڕازیيـە پێـی، بـەڵکو ئـەو دڵەیـە کـە لەگـەڵ ئـارەزوو چێژەکانیدا وەستاوە، ئەگـەر چـی لەوەشـدا پێنـاخۆش بـوونی خوایـو تووڕەبـوونی تێـدا بێـت. وەغـەیری خـوا دەپەرسـتێت لـەخۆش ویسـتن و تـرس و ئومێـدو ڕازی بـوون و تـوڕە بـوون و بەگــەورە زانــین و ســەرکزیدا. ئەگــەر تــووڕە بــوو لەبــەر ئارەزووەکـانی تـووڕە دەبێـت، وەئەگـەر کەسـێکی خۆشویسـت لەبــــەر هەوایــــەتی، وە ئەگــــەر بەخشــــی لەبــــەر هــــەواو ئارەزوواتییەتی. وە ئەگەر گرتییەوە لەبەر ئارەزوەکانییەتی. هــەوا لــە پێشــییەوەیەو ئــارەزوو ســەرکردەیەتیو نــەفامی شۆفێریەتیو بیٚ ئاگـایی کەسیەتی.[٩٩] پـەنا ئـەگرین بـەخوا ئـا لەم دڵە.

٣. دڵی نەخۆش (القلب المريض): ئەو دڵەیە کە ژیانی تێدایەو بـەڵام نەخۆشـی هەیـە، ئـەم دوو مادەیـەی تێدایـەو جارێـك ئـەم

---

[٩٩] بروانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ٩/١

ڕایدەکێشێت بەلای خۆیداو جارێك ئەو، وە لە کۆتایدا بۆ ئەو لایەیان دەبێت کە زاڵ دەبێت بەسەریدا، وە لەم دڵەدا خۆشەویستی خوای گەورەو بڕوا بوون پێیو دڵسۆزی بۆیو پشت بەستن پێی تێدایە کە مادەی ژیانێتی. وەهەروەها لەگەڵ ئەمەدا خۆشەویستی ئارەزووەکانیو هەڵپەکردن بۆ دەست کەوتنیو حەسوودیو خۆبەزلزانین و خۆبەچاکزانین و خۆشەویستی پایەو بەرزبوونەوەو فەسادنانەوە لەزەویداو سەرۆکایەتیو دووڕوویو ڕووپاماییی(ریاء)و بەخیلی تێدایە کە مادەی تیاچوون و پەك کەوتنێتی.[100] پەنائەگرین بەخوا لەم دڵە.

قورئان چارەسەری هەموو نەخۆشییەکانی دڵی لە خۆگرتووە:

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحۡمَةٌ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٧﴾) سورەتی (یونس)/٥٧

(١٠٠) بڕوانە (اغاثة اللهفان)١/٩

﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾﴾ الاسراء/٨٢.

**وە نەخۆشىيەكانى دڵ دوو جۆرن: جۆرێكيان خاوەنەكەى لە حاڵى خۆيدا ئازارى پێناگات، ئەويش نەخۆشى نەفامىو دوودڵىو گومانە. وە ئەمە لە هەردوو جۆرەكە زياتر ئازارى هەيە بەڵام بەهۆى تێكچوون و وێرانى دڵەوە هەستى پێناكات. وە جۆرێكى تريان: نەخۆشىيەكە ئازاراويەو هەستى پێ دەكرێت: وەكو خەفەت و غەم و بێ تاقەتىو تووڕەيى. وەئەم نەخۆشيە بەهۆى دەرمانى سروشتىيەوە لادەچێو بەهۆى لابردنى هۆى تووش بوونەكەىو غەيرى ئەمەوە چارەسەر دەكرێت.[١٠١]**

**وە چارەسەرى دڵ بەچوار شت دەبێت:**

**بابەتى يەكەم: بەقورئانى پيرۆز، چونكە شيفايە بۆ ئەوەى لە سنگدايە لەگومان. وە ئەوانە رادەماڵێت كە لە دڵدايە لە هاوبەشى پەيداكردن و پيسى بێ باوەڕىو نەخۆشىيەكانى**

---

[١٠١] **بروانە(اغاثة اللهفان)١/٤٤**

**گومان و دوودڵی. وەڕێنموونیەیە بۆ کەسێك ڕاستی دەزانێت وکاری پیێ دەکات و ڕەحمەتە بۆ ئەو پاداشتە نزیکە یان دوورەی کە دەستەبەری دەکات بۆ بڕواداران،** ﴿أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ **سورەتی الأنعام /١٢٢**

**بابەتی دووەم :دڵ پێویستی بە سێ شت هەیە:**

**أ–ئەو شتەی کە هێزی دەپارێزێت، ئەویش بە ئیمان و کاری چاکەو ئەنجامدانی هەموو جۆرە گوێڕایەڵیەکان دەبێت.**

**ب–خۆپاراستن لە زەرەرۆمەندەکان، ئەویش بەهۆی دوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرە یاخی بوونێك و جۆرەکانی سەرپێچی کردن.**

**ج–وازهێنان لە هەموو ماددەیەکی ئازار دەر، ئەویش بەهۆی گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوە.**

بابـــەتی سێیەم:چارەســـەرکردنی نەخۆشـــی دڵ لـــە زاڵبـــوونی دەروون بەسەریدا دووچارەسەری هەیە:

لێپرسینەوەو پێچەوانەکردنی، وە لێپرسینەوەش دووجۆرە:

أ-جۆرێکیان پێش کارکردن و ئەمیش چوار شوێنی هەیە:

١-ئایا ئەم کارە لە دەسەلاٚتیدا هەیە؟

٢-ئایا ئەم کارە کردنی چاکترە لە وازهێنانی؟

٣-ئایا ئەم کارە مەبەست لەکردنیدا خودایە؟

٤-ئایـا ئـەم کـارە پشـتیوانی هەیـەو پشـتیوانی هـەن یارمـەتی بـدەن و سـەری خـەن ئەگـەر کارەکـە پێویسـتی بەپشـتیوانی هەبوو؟

وەئەگەر وەلاٚمەکە هـەبوو ئـەوا دەسـت دەکرێـت بـە ئەنجامـدانی ئەگەرنا هەرگیز هەڵناسێت بە ئەنجام دانی.

ب-جۆرێکی تر دوای کار کردن ئەویش سێ جۆرە:

١-لێپرســـینەوەی دەروونـــی لەســـەر گوێڕایەڵییـــەك کـــە کەمتەرخـــەمی تێـــدا کردبێـــت لـــە مـــافی خـــوای گـــەورەداو بەشێوەیەکی پێویست ئەنجامی نەدابێ. وە لەمافەکانی خوای گەورە بریتییـە لـە: دڵسـۆزیو ئامۆژگـاری کـردن و پیشـاندانی

دیمەنی چاکەو پیشاندانی منەتی خوایی لەسەری تیایدا.
وەپیشاندانی کەم تەرخەمی دوای هەموو ئەمانە.
٢-لێپرسینەوەی دەروونی لەسەر هەموو ئەو کردەوانەی کە نەکردنی چاکترە لەکردنی بۆی.
٣-لێپرسینەوەی دەروونی لەسەر شتێکی (موباح) یان عادەتی کە نەیکردووە. وە ئایا بەوە تەنها نیەتی بۆ خواو دەستەبەرکردنی ڕۆژی دوایی بووە تا سەرکەوتوو براوەبێت؟ یان نیەتی دونیا بووە تا دۆڕاوبێت؟
وەکۆی ئەمانە ئەوەیە کە لێپرسینەوەی دەروونی بکات لەسەر فەرزەکان پاشان تەواوی دەکات ئەگەر ناتەواو بوو. پاشان لێی دەپرسێتەوە لەبارەی نەهی‌یەکانەوە خۆ ئەگەر زانی شتێکی نەهی لێکراوی ئەنجامداوە ئەوا بە پەلە فریای دەکەوێت بە گەڕانەو پەشیمان بوونەوە، پاشان لێپرسینەوە لەسەر ئەو کردەوانەی کە بە ئەندامەکانی لەشی کردوویەتی، پاشان لەسەر بێ ئاگایی.[١٠٢]

---

[١٠٢] بروانە(اغاثة اللهفان)١/١٣٦

**بابـــەتی چـــوارەم :چارەســـەرکردنی نەخۆشـــی دڵ لـــە دەســـت بەسەراگرتنی شەیتان بەسەریدا:**

**شەیتان دوژمنی مرۆڤەو دەربازبوون لـە دەستی بەخۆپەنادانـە شـــەرعی‌یەکان دەبێـــت. وەپێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) پـــەناگرتن لەخراپەی دەروون و خراپەی شەیتانی کۆکردۆتەوە. ئەوەتا بە (ابوبکر)دەفەرمووێت: (بڵێ: اللهم فاطر السموات وألارض. عالم الغيب والشهادة. رب كل شئ ومليكه، أشهد أن لا الـه الا أنـت. أعوذ بك من شر نفسي. ومن شر الشيطان وشركه. وأن أقترف على نفسي سواء أو أجره الى مسلم). ئەمـە بڵـێ ئەگـەر بـەيانيت کـردەوە، وەلەئێوارانـداو کـاتێکیش کـە چوویتـە سـەر جێگـای خـەوتن.[١٠٣] وە خۆپـەنادان و پشـت بەسـتن و دڵسـۆزی ڕێگـری لە دەسەڵاتی شەیتان دەکەن.[١٠٤]**

وصلى الله على عبده ورسوله محمد وعلى آله و أصحابه أجمعين ومن تبعهم بأحسان الى يوم الدين

---

(١٠٣) **الترمذي وابو داود و بروانه: صحيح الترمذي ٣/١٤٢**

(١٠٤) **بروانه: (اغاثة اللهفان)١/١٤٥-١٦٢.**